زنجیرەی هاوەڵانی پێغەمبەر

(٥)

# ئەبوو ئەیووبی ئەنصاری

## (خالیدی کوڕی زەید)

حبيب محمد سعيد

١٤٠٢ ك - ١٩٨٢ ز



زنجیرەی هاوەڵانی پێغەمبەر

( ٥ )

# ئەبوو ئەیووبی ئەنصاری

## (خالیدی کوڕی زەید)

حبیب محمد سعید

١٤٠٢ ك - ١٩٨٢ ز

---

چاپخانەی ( الحوادث ) ، بەغدا - ١٩٨٢

بسم الله الرحمن الرحيم

ئازیزەکانم ، ئەی هاوەڵە شیرینەکانی پێغەمبەری خــوا ...

چاك لام ڕوونە تەنها موسڵمانەکان بەدڵ و بە گیان ئێوەی بەڕێزیــان خـۆش ئەوێـت ، چونـکە ڕەفتاری شیرین و کاری مەردانەتان شارەزان .. بەڵام نەفام و هەرزە و خۆپەرست و خەڵەتاو و مێشك بەنج کراوو بەکرێ گیراوی کانی بێگانەی کافر ، هەر وەك شەمشەمە کوێرە توانای بینینی خۆری نی‌یە ، ئەوانیش دڵیــان اقەت ناگرێ ژیانــی ئێـوەی قـارەمـان پێشکەش بـــە موسڵمانەکان بکرێت ، چونکە خۆیان ئەزانن ئیتر نیازی گڵاویان نایەتە دی ..

# پێشکەش

**پێشکەش بێت :**

★ بەو موسڵمانانەی کە پەیمانی وەفاداریی و راستگۆیی بەرامبەر بە ئایینەکەیان ئەدەن بەخوا .

★ بەو موسڵمانانەی سەروماڵیان تەرخان ئەکەن بۆ بەرز کردنەوەی ئالای خوا لەسەر زەویدا ..

★ بەو موسڵمانانەی کە پێغەمبەری ئازیزیان ـ صلی الله علیه وسلم ـ لەگیان و سەرو ماڵیان خۆشتر ئەوێت و هەمرو شتێ ئەکەنە قوربانی خۆی و رێبازەکەی ..

# پێشەکی

الحمد لله رب العالمين ، الصلاة والسلام على سيد المرسلين واتباعه المخلصين اجمعين .

ژیان بەبێ بیروباوەڕ ژیانێکی هیچە ، بگرە ژیان نی‌یە مردنە .. بەڵام بە دەردی سەریی و مەینەت و سزاو ئازارەوە ..

کەواتە بیروباوەڕ مایەی سەربەرزیی مرۆڤە . . مایەی حەسانەوەی مرۆڤە .. مایەی ژیانی ئاسوودەیی و بەختیاریی و کامەرانی مرۆڤە ، لە هەردوو جیهاندا ..

بیروباوەڕێ کە ئەمەی لێ‌بێ تەنها ئیسلامە . . تەنها ئیسلامە دەردی ئادەمیزادی گیرخواردوو چارەسەن

بکا •• تەنها ئیسلامە و بەس ، ئیتر هەموو توولە ڕێگاکان دەستی مرۆڤایەتی‌یان بڕیوە •• تۆڕی ڕاوکردنی ئادەمیزادی چاوبەستراون ••

هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خوا ـ صلی اللە علیە وسلم ـ زۆر چاك لەمە گەیشتن بۆیە بڕیاریان دا سەرو ماڵیان بکەنە قوربانیی ، تابیروباوەڕەکەیان گەشە بکاو جیهان گەش بکاتەوە ••

کەواتە ژیانی قارەمانان بەم شێوەیە بووەو هەر بەم شێوەیەش ئەبێت ••

بەڵام ئەوانەی کە لەهەر کوێ بابوو لەوێ شەن ئەکەن ، ئەوانە نەنرخی خۆیان ئەزانن وە نەنرخی بیروباوەڕیش ، وە ئەو وشە ورشەدارانەش کە لە زمانی لووسیان دەرئەچن تەنها وشەن و بەس •• وشەش بەتەنیا ڕۆژێ لە ڕۆژان ئادەمیزادی نەحەساندۆتەوە ••

ئەمە راستی‌یەکە پێویستە هەڵگرانی بیروباوەڕی قوڕئان لەبەر چاویان بێت ..

پێویستە بزانن موسڵمان بوون بریتی‌یە لەپەیماندان بە خوای گەورە ، ئینجا تێکۆشان بەسەرو بەماڵو بەخۆشویستنی شەهیدیی و باك نەبوون لە خەشم و قینی کافران ..

هیوادارم خوای گەورە لەسەر راستی رامان گرێ و مەبەستیشمان لە هەموو کارێکدا رەزامەندیی ئەوبێت و بەس ..

نووسەر

٦ی / موحەڕڕەمی / ١٤٠٢

٢ی / تەشرینی دووەمی / ١٩٨١

# بەختەوەر

ئیماندارانی مەدینە ئەمسات و ئەو سات بەتەمای بەدیدار شادبوونی پێغەمبەری ئازیز بوون ، تا ئەوەبوو گەیشتە بەرەوەو لە قەراغ مەدینەدا ، لە « قوباء » ، چوار رۆژ مایەوەو لەو ماوەیەدا مزگەوتی قوبائی دروست کرد ، کە یەکەم مزگەوتێ بوو موسڵمانان بنیاتیان نا تا ببێتە مەڵبەندی خواناسیی ..

ئینجا دوای ئەوە پێغەمبەری خوا - صلی الله علیه وسلم - قوبائی بەجێهێشت و بە سواریی وشترەکەی هاتە ناو مەدینەوە .

ئەبێ بۆ ماڵی کێ بڕوا ؟

کێ هەڵبژێرێ و ببێتە میوانی ؟

پیاو ماقووڵان و ناودارانی مدینە ئەهاتنە سەررێگەی و

هەریەکەیان هەوڵی ئەدا پێغەمبەری خـوا ـ صلی اللـه علیه وسلم ـ لەماڵی ئەوا دابەزێ ..

یەك لە دوای یەك گەورە پیاوان ئەهاتنە رێگاکەی‌و دەریان ئەبڕی کەوا زۆر حەز ئەکەن ببێتـە میوانیـان‌و بەخزمەتی بگەن‌و هێزو تواناو غیرەتیان بکەنـە قەڵغـان بۆی ...

هەریەکەیان بە ئاواتـەوە بـوو خۆشـەویسـتی موسڵمانان‌و فێنکی دڵیان‌و رۆشنایی چاوەکانیان لە ماڵـی ئەوا میوان بێت ، تاخێرو بێر بڕژێ بە سەریا ..

لەوانەی کە هاتنە رێگای کۆمەڵێ لە تیرەی عەدیی کوڕی نەججار بوو کە خاڵوانی باپیری پێغەمبەر بوون ، وتیان بە پێغەمبـەر ـ صلی اللـه علیه وسـلم ـ : ئێمـە خاڵوانتین ، خێراکە ، وەرە دابەزە لامان ئێمە خـاوەنی پیاوو هێزو دەسەڵاتین ، ئیتر باخزمایەتییمان بووستێ .. لە ئێمە تێپەڕ مەکەو مەچۆ بۆ لای کەسـی‌تر .. ئـەی

پێغەمبەری خوا لەبەر خزمایەتییمان کەسی تر لە ئێمە لە پێشتر نییە بۆت ..

بەڵام پێغەمبەر ئازیز ـ صلی اللّٰه علیه وسلم ـ کە هەموو رەفتارێکی رێك‌و پێك‌و بێ کەم‌و کوڕییە ، بـۆ ئەوەی دڵی هەموویان رازیی بێت‌و هەست بە جیاوازیی نەکەن هەرچی‌جارێ کۆمەڵێ هەوڵیان ئەدا وشـترەکە لاپێ‌بدەن ، ئەیفەرموو :

« دعوها فانها مأمورة ـ وازی لێ بێنن ، فـەرمانی پیادراوە » .

فەرمانی پیا دراوە تاهەر شوێنێ خوا بیەوێ دیاریی بکا .. شوێنێ دیاریی‌بکا تابێتە مزگەوتی ئیسـلام ... تابێتە خانووی پێغەمبەری ئیسلام .. تا بێتـە شـوێن‌و ماوای پێغەمبەری ئازیز ، هەتا دوای کۆچ‌کردنیشی ..

وشترەکە هەروا بەپێی ئەو نەخشەیەی کە بۆی

کێشـرابـــوو ، ورده ورده و لەسەرخـۆ هەنـگاوی هەڵئەگرت ، لەکاتێکا سەرداری مرۆڤایەتیی بە سـەر پشتیەوە بوو •• کۆمەڵی ئیمانداریـش ـ بـە تایبەتیی ئەنصارەکان ـ وان لەوپەڕی خۆشیی و کامەرانیدا •• ئەم رۆژە بەگەورەترین رۆژی تەمەنیان ئەزانن کـەوا خۆشەویستی خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ کۆچـــی کردۆتە ناویان ، بۆیە هەریەکەیان بە ئاواتەوە بـوو ، وشترەکـە لەبـەردەم ماڵـی ئەوانـا چـۆك دابـدا تـا خۆشەویسترین پیاو بێتە میوانیان ••

جاچ خۆشیی و کامەرانی یەك لە جیهانا ئەگانە ئەوەی کـە پێغەمبـەری ئیسـلام ، رزگارکـەری مرۆڤایـەتیی ماف خوراو ـ صلی الله علیەو سلم ـ بێتە میوان •• بێتە میوانی کێیش ؟! میوانی ئەوانەی کە بە شێوەیەك بوونـە کۆمەك و پشتیوان بۆ ئایینی خوا کە کەقورئانی پـیرۆز باسیان ئەکا !!

هەرکە وشترەکە بەردەم ماڵێکی بەجێ ئەهێشت خەم و خەفەت ئەو خێزانەی دائەگرت و خۆشیی و تیشکی هیوا ئەکەوتە دڵی ماڵی دووەمەوە کە بەڵکو میوانی ناوازە بەرئەوان کەوێ ..

هەروا وشترەکە لەسەر ڕەوتی خۆی بەردەوام بوو بەرەو شوێنی دیاری کراو بۆی .. موسڵمانەکانیش بە دوایەوە ئەڕۆیشتن و بە گەرمیی چاوەڕێیان ئەکرد تا بزانن کێیە ئەوەی وا ئەوەندە خوا بەختەوەری کردووە و پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ ئەبێتە میوانی ؟

هەتا ئەوەبوو گەیشتنە گۆڕەپانێکی چۆڵ و تیایا چۆکی دادا .. بەڵام پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ دانەبەزی .. دوای تۆزێك وشترەکە هەڵساو کەوتە ڕێ ، پێغەمبەریش ـ صلی الله علیه وسلم ـ جڵەوی بۆ شل کردبوو .. تا سەربەستیی خۆی وەرگرێ و چۆن

فەرمانی پیا دراوە وا بکا •• ئەوەنـدەی پـێ نەچـوو گەڕایـەوە دواو لەشوێـنی یەکـەم جاریـان چۆکـی دادایەوە • •

خاوەن ماڵ کە ئەمـەی دی هەسـتی کـرد کەوا پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ بووە بەمیوانی ئـەوان •• خۆشیی و شادمانـیی کەوتـە دڵـی ئەبـوو ئەیووبەوە (١) ••

چ بەخششێکی ئەم سەر زەوی‌یە ئەگاتە ئەمەی کە پێغەمبەری ئیسلام‌و خۆشەویستی موسڵمانان ـ صلی الله وسلم ـ بێتـە میوانـی ؟ ئەبـێ چ فـەڕو پیرۆزیـی و بەختەوەرییەك بڕژێ بە سەریانا ؟!

---

(١) ئەبوو ئەییووب خەزرەجی‌یە و بەشداریی پەیمانی عەقەبەی دووەمی کردووە •• پێغەمبەری خـوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ لەگەڵ موصعەبی کوڕی عومەیردا کردنیە برا ••

بۆیە خێرا لە ناو موسڵمانە راوەستاوەکانا بەوپەڕی خۆشی‌یەوە دەرپەڕی‌و لە پێغەمبەری ئازیز ـ صلی الله علیه وسلم ـ چووە پێشەوە و بەخێر هاتنێکی گەرمی لێ کرد •• بەخێرهاتنێکی وەهای لێ‌کرد کە زمان و پێنووس ناتوانن دەری بڕن مەگەر تەنها دڵ و رۆحی موسڵمان بزانێ چۆن بە خێرهاتنێك بووە!! ئینجا شت‌و مەکەکانی هەڵگرت و دای بەشانیا ، هەروەك هەموو گەنج و جەواهێری دنیای هەڵگرتبێ •• هەڵی گرتن‌و بردنیەوە بۆ ماڵی خۆیان‌و ئەسعەدی کوڕی زورارەش وشترەکەی بردەوە ماڵی خۆیان •

کە پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ دابەزیی‌و بۆی دەرکەوت ویستی خوا وایە ئەم شوێنە بکرێتە مزگەوت‌و نیشتگای یەکجاریی خۆی ، جا فەرمووی :

« رب انزلنی منزلا مبارکا وانت خیر المنزلین » ••

ئینجا لەبارەی شوێنەکەوە ــ کە خەرمانی وشك کردنی خورمابوو ــ پرسیاری کرد ••

خەرمانەکە هی دوو هەتیو بوو کە ئەسعەدی کوری زورارە سەروکاریی ئەکردن ••• دوو کوڕەکـە کـە زانی‌یان پێغـەمبەری خـوا ــ صلی اللە علیـە وسـلم پێویستە شوێنی چۆك دادانی وشترەکە بکا بە مزگەوت ، ویستیان بە خۆڕایی دەستی لێ هەڵگرن لە پێناوی خوادا، بەڵام پێغەمبەر ــ صلی اللە علیە وسلم ــ ئەمەی پەسـەند نەکردو لێ‌ی کڕین ــ دیارە بـە ئامادەیی مامـۆکەیان ئەسعەدی کوڕی زورارە ــ بە دە دیناری ئەو چەرخە••

ئەبوو ئەیبووب سوپاسی خوای پەروەردگاری کرد بۆ ئەم بەخششە گەورەیە کەوا خۆشەویستەکەی کردە

میوانیو له ناو هەموو ماڵە موسڵمانەکانا ئەوی بۆ ئـەم بەخششە هەڵبژارد ••

پێغەمبەری خۆشەویست ـ صلی الله علیه وسلم ـ چووە ماڵی ئەبوو ئەییوب •• خانووەکەیان دوو قـات بوو •• جا ئەبوو ئەییووب بۆ ئەوەی زیـاتـر رێـز لـە میوانی ئازیز بگرێت باڵاخانەکەی بۆ چـۆڵ کرد ••• بەڵام پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسـلم ـ دڵی بـەقاتی خوارەوە بوو ، ئەویش لە فەرمانی دەرنەچـووو قاتی خوارەوەی بۆ چۆڵ کرد ••

شەو داهاتو پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ میوانەکانی کە لای بوون هەڵسانو ئەبوو ئەیبـووبو خێزانەکەشی سەرکەوتن بۆ سەرەوە بۆ شوێنی خۆیان•• هەر ئەوەندە بوو دەرگایان داخست ، خێرا ئەبوو ئەییووب

ئاوڕی دایەوە بۆ لای خێزانەکەی‌و پێی وت :

ماڵی کاولمان ، چیمان کرد ؟ !

ئایا ئەگونجێ پێغەمبەری خوا ـ صلى الله عليه وسلم ـ لەخوارەوە بێت‌و ئێمەش لەە سەرەوە ؟ !

ئایا ئەگونجێ ئێمە بکەوینە نێوانی پێغەمبەرو وەحی‌یەوە ؟ ! کەواتە ئێمە تیا چووین ..

ژن‌و مێردە کەوتنە گێژاوی پەشیمانیی‌و سەرسامی‌یەوە .. خەم‌و خەفەت دایگرتنەوە .. خۆشیی و شادمانی هاتنی میوانی ئازیزیان لێ تێك چوو . لە بەر خۆیانەوە بەختەوەرترین خێزانی مەدینە بوون ، کەچی وا خەم‌و پەژارەی ئەم نەزانکارییەیان یەخەی پێ گرتن ..

تازە چاریان نی‌یە ، ئەبێ ئارام‌بگرن تارۆژ ئەبێتەوە .. ناچار چوونە لایەکی خانووەکەوەو کەناریان گرت تاراستەوخۆ بەسەر سەری پێغەمبەری خواوە نەبن ، وە

به کەناراو بەسەر نووکی پەنجەی پێیانەوە هـات و چۆیان ئەکرد ..

خۆشەویستی‌یەك لە دڵەوە بێت زۆر جیاوازە لەوەی کە لەبەر رووگیری‌یی وە یا ترس پیشان بدرێ .. پرۆگرامە نەفامی‌یەکان ئەم جۆرە خۆشەویستیی و رێزە بە خۆیانەوە شك نابەن و ناتوانن لە دڵ و دەروونـی شوێنکەوتووەکانیاندا بیروێنن ..

ئەمە یەکێکە لە جیاوازی‌یەکانی نێوان ئیسلام و هەموو رێبازە نەفامی‌یەکان ..

هەرچۆنێ بوو رۆژیان لێ بۆوە .. ئەوسا ئەبوو ئەییووب هاتە لای پێغەمبەروو وتی : بەخـوا ئیمشـەو نە منیش و نە ئوم ئەییووبیش چاومان نەناوە بەیەکا ..

پێغەمبەر ـ صلی اللە علیە وسلم ـ فەرمووی :

لە بەرچیی ئەبوو ئەییووب ؟!

وتی : بیرم کردەوە کەوا من وام بەسەر خانوویێکەوە کە تۆ وای لە ژێریا وە ئەگەر بجوولێمەوە تۆز ئەبارێ بە سەرتاو ئازارت ئەدا ، ئینجا من کەوتوومەتە نێوان تۆ و وەحی‌یەوە ..

فەرمووی :

خۆت ناڕەحەت مەکە ئەبوو ئەییووب ، لەبەر ئەوەی خەڵکی زۆر سەرمان لێ دەدات واچاکترە بۆ ئێمە کە لەخوارەوە بین ...

ئەبوو ئەییووب ئەڵێ :

گوێڕایەڵیم کرد بۆ فەرمانەکەی پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ تا لە شەوێکی ساردا گۆزەی ئاوەکەمان شکا و ئاوەکەی ڕژایە ناو باڵاخانەکەوە .. خێرا هەڵمەتمان برد بۆ نەهێشتنی ئاوە ڕژاوەکە ، وە جگە لە قوماشێکی قەدیفە کە لە جیاتی لێفە ئەمانـدا

بەخۆمانا هیچمان بەلاوە نەبوو ، بە پەلە دەستمان کرد بە وشك کردنەوەی ئاوەکە پێ‌ی نەوەکو دڵۆپە دا بداتە خوارەوە سەر پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیە وسلم ـ .

هەرکە رۆژ بووەوە هاتمە خوارەوە لای پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ و وتم :

لەجێ‌ی دایك و باوکم ، پێم ناخۆشە من لە سەرەوە بم و تۆش لە خوارەوە .. ئینجا دەنگ و باسی گۆزەکەم بۆ گێڕایەوە و ئەویش بەگوێی کردم و سەرکەوت بۆ بالاخانەکە و خێزانەکەشم دابەزینە خوارەوە ..

تا ئەم رادەیە موسڵمانەکان بە تەنگ دڵ ئارامیی پێغەمبەری خواوەبوون .. نەیان ئەهێشت دڵی گەرد بگرێ .. سەربازی بەوەفا و مەرد و قارەمان بوون .. بۆیە رەزامەندیی خواو سەربەرزیی هەردوو جیهانیاز

وه دەست هێنا ••

پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیم وسلم ـ نزیکەی حەوت مانگ لە ماڵی ئەبوئەیووبا مایەوە هەتا مزگەوتەکەی خۆی ـ لەو زەوی‌یە چۆڵەدا کە وشترەکە چۆکی تیا دا دا (١) ـ تەواو بوو و گواستیەوە بۆ ناو ئەو ژوورانەی کە بە دەوری مزگەوتا بۆ خۆی و خێزانەکانی کردبووەوە •

بەمە خوای گەورە ویستی وابوو خێر و خۆشیی و پیرۆزی دراوسێیەتیی پێغەمبەر ـ صلی اللّٰه علیه وسلم ـ لە کیس ئەبوو ئەیووب نەدات ، تا بەوپەڕی میهرەبانی‌یەوە پێکەوە بژین و لە قووڵایی دڵیانا یەکتری‌یان خۆش بوێ ، بە شێوەیەك کە هیچ جیاوازیی ومن و تۆیەك لە نێواندا نەبێت ••

---

(١) شوێنی چۆك دا دانی وشترەکە ئێستە میمبەری مزگەوتەکەی پێغەمبەرە ـ صلی الله علیه وسلم ـ لە مەدینە ••

# پێشڕەوای ڕاستەقینەو موسڵمانی دڵگوشاد

هێمنیی و ئاسایش و برایەتیی و بە یەکگا بوون و خۆشەویستیی باڵیان کێشا بوو بە سەر پایتەختی دەوڵەتی قورئاندا .. کۆمەڵی خوانەناس خەریکی خواناسیی و پەروەردە و بەڕێوەبردنی کاری ڕۆژانەی سەرشانی بوو.. خەریکی بنیات نانی قەڵای دادو یەکسانیی بوو تا ببێتە پەنای ماف خوراوان ..

کۆمەڵی جوامێر ملکەچی فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەری خوا بوو .. بۆیە هەموو ڕێگایەکی سوود بەخشی گرتبۆوە بەر بۆ گەیشتن بەو ئامانجە بەرز و پیرۆزانەی کە مایەی حەسانەوەی ئادەمیزادن ..

بە تایبەتیی پێغەمبەری ئازیز و هاوەڵە زۆر نزیکەکانی ، ئەمان زیاتر لە هەموو کەسێ بەرژەوەندیی

نایبەتی‌یان لەبیرچووبۆوە لە پێناوی خزمەت کردنی ئیسلامی بێگەرد ، ئەمان خۆیان‌و ماڵ‌و خێزانیان لەبیر چوو بۆوە ، مەبەستی سەرەکی‌یان لەژیان بریتی بوو لەخزمەت کردن ..

دیارە هەموو سەرکردە و هەڵسووڕێنەرانی کاروباری وڵاتان دەستبەرداری کاسپیی ئەبن و ژیانیشیان بۆ مسۆگەر ئەکرێت لە بەرزترین پلە و تواناد‌ا ..

بەڵام پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ وە هاوەڵە نزیکەکانی ـ خوا لێیان رازیی بێت ـ جیاوازی‌یان زۆرە لەگەڵ سەرکردە و دەسترۆیشتووە نەفامەکانا ، چونکە نەفامان جگە لەو دەست بڕین‌و خوێن مژینە هیچی تریان لێ نایێ و هەموو شێوەیەك ژیان و رابواردنی خۆیان و خزم و کەس و کاریان مسۆگەر ئەکەن و هەموو هەوڵ و کۆششێکیان بۆ پارێزگاریی و بەردەوامیی رابواردن و ژیانە ئاژەڵی‌یەکەیانە ..

کەچی پێغەمبەر ـ صلی اللە علیە وسلم ـ و هاوەڵانی بەر لەوەی بەخششی ئاسمانیان بۆبێت هەر یەکەیان پیاوێکی لیهاتووی دەست و دەم پاك و مەردانە ئەژیا و گوزەرانی مسۆگەر دەکرد • بەڵام دوای هاتنی ئیسلام و گران بوونی ئەرکی سەرشانیان ناچار بوون دەست بەرداری کاسپیی ببن و ئاوڕی یەکجاریی بدەنەوە بۆلای ڕێبازی ڕزگارکەر •• لەگەڵ ئەمەشا هێشتا ژیانێکی ئاساییشیان نەئەکرد چ بۆ خۆیان وە چ بۆ خاوخێزانیان بەڵکو ئەو دارایی و سامانەی کە هەیان بوو یا ئەوەی کە ئەهاتە مشتیان زۆربەی زۆریان لەپێناوی ئیسلامدا خەرج ئەکرد •• بەمە خۆیان بە جارێ لە ژیانی ئەم جیهانە بێبەش کردبوو بە هیوای ژیانی پاشە ڕۆژەوە چونکە هەڵسووڕێنەری کاروباری موسڵمانەکان بوون !!

ئەو موسڵمانانەش کە دەست ڕۆیشتووبوون بەوپەڕی جوامێرییەوە دەستیان ئەدایە ماڵو سامانیانەوە تا

ڕەزامەندیی پەروەردگاریان دەستکەوێ ..

عەبدوڵلای کوڕی عەبباس - خوا لێیان ڕازیی بێت- ئەگێڕێتەوە :

لە قوڵەی گەرمای نیوەڕۆیەکی هاویندا ئەبوبەکر - خوا لێی ڕازیی بێت - دێتە دەرەوە بۆ مزگەوت و عومەر - خوا لێی ڕازیی بێت - چاوی پێ ئەکەوێ و ئەپرسێ :

چۆن لەم ساتەدا هاتوویتە دەرەوە ؟!
ئەڵی : لە تاوی برسێتیدا !
عومەر ئەڵێ : بە خوا منیش تەنها لەبەرئەوە !!

لەم کاتەدا پێغەمبەری خوا - صلى الله عليه وسلم - هاتە دەرەوە و لێی پرسین :

چۆن لەم ساتەدا هاتوونەتە دەرەوە ؟ !
وتیان : لەتاوی ژانە سکی برسێتییدا !

فەرمووی : بەو خوایەی گیانمی بەدەستە منیش تەنها لەبەر ئەوە ••

ئازیزەکانم •• خۆشەویستەکانم •• پێشەواکانم •• ئەی هەڵگرانی بانگی رزگاریی راستەقینە •• ئەی هەڵگرانی مەشخەڵی ئازادیی راستەقینە •• ئەی پاڵەوانانی رێگای سەربەستیی و دادو یەکسانیی ••

ئەی پێغەمبەری ئازیز •• ئەی ئەبوبەکری خۆشەویست • • • • ئەی عومەری قارەمان دڵم گڕی گرتووە •• هەست و هۆشم خرۆشاوە •• سەرم سوڕ ماوە لە ئادەمیزادی بەدبەختی سەرلێشێواوی مێشك بەنج کراوی چاوبەستراو • • وابشتی لەڕێبازە بێگەردەکەی خوا هەڵکردووە و بەملی کەچ و سەری شۆڕەوە شوێنی رێبازە نەفامی یە زیان بەخشەکان کەوتووە ••

بەنیازی خۆی ئەیەوێ لە سایەی ئەو بیروباوەڕە دەست بڕانەدا بحەسێتەوە •• نازانێ هەتا ئەوە رێرەوی

بێت مەگەر هەر زامەکانی بە سۆبن و پێیانەوە بتلێتەوە ••
بەنیازی خۆی پێشەوای دڵسۆزی دەست نیشان کردووە ، نازانێ بە سەر خوێن و گۆشت و عارەق و شەرەفی ئەوەوە ئەوان ئەگەنە ئاوات •• ئاواتی گلاویان •• سەرەنجامیش پەشیمانیی هەر دوو جیهانی بە شوێنەوەیە •

ئازیزەکانم •• ناچارم بەپێی توانا تاهەرکوێ دەنگم و دەنگی هەموو برایەکی ئیماندارم بڕ ئەکا ، بە هەموو هێزێکمانەوە ، هاوار بکەینە ئادەمیزاد : ئیتر بەسیەتی• بگەڕێرەوە •• تاکەی بەدەستی خۆت ، خۆت ئەکەیتە • بەندەی ئەڵقە لە گوێی دوژمنانی مرۆڤایەتیی ؟!

تاکەی بەدەستی خۆت ، خۆت ئەکەیتە نێچیریان ؟ !

تاکەی بەدەستی خۆت قوڕاو ئەگریتەوە و خۆتی تێئەخەیت ؟!



وەرە بە ویژدانەوە ، بەبێ لایەنگیریی ، سەرنجی مێژووی ئادەمیزاد بدە ..

بزانە داخۆ سەربازخانەی خوا دۆستی ئادەمیزاد بووە و حەسانەوەی پێشکەش کردووە یان سەربازخانەی شەیتان ؟!

بزانە داخۆ لە سایەی بەرنامەی خوادا مرۆڤایەتیی سەربەست و رزگار بووە یان لەسایەی بەرنامەی نەفامیدا ؟ !

بەڵێ ، پێغەمبەری ئازیزو ـ صلی الله علیە وسلم ـ ، دوو هاوەڵی نزیکترینی ئەمە رابواردن و خۆشی‌یانە لە سایەی حکومەتێکا کە خۆیان کاربەدەستو هەڵسووڕێنەرینی !!

کۆمەڵی ئیماندار وا لەوپەڕی خۆشییو ئارامییدا، کەچی سەرکردە و پێشەواکان دەستیان لە بەرژەوەندیی

خۆیان بەرداوە بۆ خزمەتی ئیمانداران و وابڕی‌یانە ..
هەتا نانی وشکیش کە برسێتیی بێویژدان سەرکوت بکا
دەستیان ناکەوێت .

بـا مرۆڤە ماف خوراوەکان بێن ..
بـا مرۆڤە راستی‌ی ویستەکان بێن ..
با مرۆڤە داد ویستەکان بێن ..
**بـا مرۆڤە رەش و رووتەکان بێن ..**
بـا مرۆڤە خاوەن دڵ و مێشك و ویژدانەکان بێن..
**بـا بێن و سەیرکەن .. ئەمەتا رێباز .. ئەمەتـا**
یاسـا .. ئەمەتا مـاف .. ئەمەتـا یەکسانیـی و دادو
خۆنەویستن .. بەسیەتی خۆخەڵەتاندن !!

ئینجا پێغەمبەری خۆشەویست ـ صلی الله علیـه
وسلم ـ فەرمووی :

**هەڵسن بێن لە گەڵما ..**
هەرسێکیان بـەرەو ماڵـی ئیماندارێـك کەخـواو

پێغەمبەری خوای خۆش ئەویست کەوتنەڕێ •• بەرەو ماڵی ئەبوو ئەیووبی ئەنصاریی ، دراوسێی پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ •

ئەبوو ئەیـووب زۆر پێغەمبـەری خوای خۆش ئەویست ، بۆیە هەموو رۆژێ خواردنی تایبەتیی بـۆ ئەخستە لاوە ، جا ئەگەر دوابکەوتایە و لەکاتی خۆیـا فریـای نەکەوتایـە ئەوسـا ئەیدایـە دەرخـواردی خێزانەکەی • •

ئەبوو ئەیووب ئەڵێ :

نانی ئێوارەمان چاك ئەکرد بۆ پێغەمبەر ـ صـلی الله علیه وسلم ـ و ئەماننارد بۆی ، کاتێ پاشخوانەکەی ئەناردەوە من و خێزانەکەم ئەگەڕاین بزانین لە کام لاوە جێگە دەستەکەی تیا دیارە ، تاڵێی بخۆین و پیرۆزیمان دەست کەوێ ••

کاتێ گەیشتنە بەر دەرگاکەیان خێزانەکەی هاتە

دەرەوە و بەوپەڕی دڵ فراوانیی و میوان پەزێری‌یەوە بەخێرهاتنی لێ‌کردن •• جا پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ فەرمووی :

ئەبوو ئەیووب لە کوێیە ؟

ئەبوو ئەیووب لەناو باغێکی دارخورمای نزیکیدا ئیشی ئەکرد ، کە دەنگی پێغەمبەری بیست بەپەلـــە هاتەوە و ئەویش بە خێرهاتنێکی گەرمی میوانەدنـــی کردو بەسەر سوڕمانەوە وتی :

ئەی پێغەمبەری خوا، تا ئێستە لەم کاتەدا نەهاتوویت بۆلامان (١) •• فەرمووی : راست دەکەی •

(١) ئەم وتەیەی ئەبوو ئەیووب ئەوە ئەگەیەنێ کـە یەکەم جارە پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ لە خۆیەوە و لە کاتی نان خواردندا چووبێتە ماڵــی ئەبوو ئەییووبی دراوسێی ، بەڵکو هەر ماڵێکی‌تر کە ئەبوو ئییووب ئاگاداربێ •

ئینجا ئەبوو ئەییووب فڕکەی کرد و لەناو باغەخورماکەیدا هێشووە خورمایەکی بڕی ، کە خورماکانی لە گەییو و نیوە گەییو تێکەڵ بوو و هێنایەوە بۆ میوانە ئازیزەکانی •• پێغەمبەری خوا ـ صلی اللە علیە وسلم ـ پێی ناخۆش بوو ئەبوو ئەییووب زیانی لێبکەوێ بۆیە فەرمووی :

نەمویست ئەمە ببڕیت ، بۆچ خورما گەییوەکانت بە هێشووەکانەوە نەچنی بۆمان ؟

وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ، پێم خۆش بوو لەگەییو و نیوە گەییوەکانیش بخۆیت ، وەهەروەها حەیوانێکیشت بۆ سەر ئەبڕم ••

فەرمووی :

ئەگەر سەرت بڕی شیردەر سەر مەبڕە

ئەبوو ئەییووب خوا خوای رۆژێکی وەهای بوو تا دراوسێی خۆشەویست بە پەرمینەوە خۆی بکا بە مالیا و میوانی تریش لەگەڵ خۆیا بێنێ • بۆیە خێرا چتیرێکی گرت و دای بە زەویدا ، ئینجا بەخێزانەکەی وت : تۆش نانی تازەمان بۆ پێ بگەیەنە •• خۆیشی چتیرەکەی کەوڵ کردو کردی بە دووبەشەوە : بەشێکی سوور کردەوە و بەشەکەی تریشی برژاند •• تا ئەم ئەمەی کرد خێزانەکەی گورج وگۆڵ نانی گەرمی پێ گەیاند ••

کاتێ خواردن پێگەیشت و خرایە بەردەستی پێغەمبەر و دوو هاوەڵەکەی ، پێغەمبەر ـ صلى الله عليه وسلم ـ پارچەیەك لە گۆشتەکەی هەڵگرت و خستیە ناو نانێکەوەو فەرمووی :

ئەبوو ئەییووب هەستە بە پەلە ئەم پارچەیە بەرە بۆ فاطیمە ، چەند رۆژێك ئەبێت لەمەی دەست

نەکەوتووە (١) •

هەڵوێستەکانت زۆر بەرزو پیرۆزن ئەی پێغەمبەری ئازیزم ، ئەی رزگارکەری مرۆڤایەتیی •• تەنها خۆت نیت کە بەرزەوەندەی تایبەتییت خستبێتە پشت گوێ ، بەڵکو هاوەڵە نزیکەکانت •• وەزیــری دەستەراستو دەستە چەپت •• خــێزانو منداڵەکانیشت هاوبەشن لــە

(١) ئەمە دەری ئەخا خێزانەکانیان بە پلەی خۆیـــان برسیی نەبوون ، وە هیچ نەبێ شتێکی ئەوتۆیان بووە تاخۆیانی پێ تێربکەن ، بەڵام لە سنووری تێر بوونی ماڵ و منداڵدا ، نەك بەشی سەرۆك خێزانەکان بکات ، بۆیە وا برسێتیی زۆری بــۆ هێنابوون •• ئەمەش لەوەوە وەری ئەگرین کــە موسڵمان ئەبێ پیشـــەی خۆنەویســـتن بــێ •• خزمەت کردن بێ •• لە ئەرکا لەپێشەوە و لەمافدا لەدواوە بێ •• بۆیە ئەبێ دوای بێخەم کردنـــی خێزان و منداڵ ئەوســـا خەمـــی خۆیبخـوا ، وە هەروەك لەپێشەوە رەعیەتەکەی تێر ئەکا وەهاش خێزانەکەی پێش خا •• ئەمە سەرسوڕمانیشی ناوێ چونکە پەروەردەی قورئان ناوازەیە ••

هەڵمەتی رزگاریخوازیدا •• فاطمەی نازداریش • •
ئەو فاطیمەیەی کە یەکێکە لەو چوار ئافرەتەی کە لە ناو
هەموو ئافرەتاندا بە تەواویی پێگەیشتوون ئەویش
بەشدارە لەم هەڵوێستە بەرزەدا •• لەم خۆنەویستنەدا ••
لەم خزمەتە گەورەیەدا •• فاطیمەی جگەرگۆشەت چەند
رۆژێك گۆشت بە چاو نابینێ •• کەچی هەر دەم بەتاڵێکی
خۆپەرست توانیی دووکەس بخەڵەتێنێ و دەست
خەرۆیان بکا ، لافی رزگاریی و رزگاریخوازی لێ
دەدات (١) ••

---

(١) لەراستییدا هەڵبژاردنی ناوچەی حیجازی وشك و
کەم دەرامەت و ژیان و گوزەران سەخت ، بۆ
ئەوەی درەختی ئیسلامی تیا بنێژرێت ، دانایەتیی
زۆری تیایە ، یەکێکیان ئەوەیە ئەم نەمامە پێویستی
بەپیاوانی لێهاتووی بەرگەگر هەیە کە هەموو
تاڵیی و سوێرییەکیان بەلاوە ئاسان بێت و بتوانن
بەرگەی شالاوی نەفامیی و تەنگ و چەڵەمەی
رۆژگار بگرن ، وە بتوانن رۆژانی رەش و پرستەم
و مەینەتیی و کەم دەرامەتیی بەسەر بەرن ••

بەڵێ میوانەکان لە ماڵی ئەبوو ئەیووب تێریـــان خوارد ئینجا پێغەمبــەر ـ صـلی اللـه علیـه وسـلم ـ فەرمووی :

« نان و گۆشت و خورما و خورمای نیوە گەییو و خورمای تەواو گەییو » !! وە فرمێسك بەچاوەکانیا هاتە خوارەوە ، ئینجا فەرمووی :

«بەو خوایەی گیانمی بەدەستە ئەمە ئەو نازو نیعمەتەیە کە لەرۆژی قیامەتا لەبارەیەوە پرسیارتان لێئەکرێ (١) جا ئەگەر لەمەتان بێبەخشرا و دەستتان کرد بە خواردنی بڵێن : « بسم الله »وە دوای تێر خواردنیش بڵێن :

« الحمد لله الذي هو اشبعنا وانعم علينا فأفضل »٠

---

١) مەبەستی پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسـلم ـ لەئایەتی هەشتەمی سوورەتی ( التكاثر )ە کـــە ئەفەرموێ :

( ثم لتسئلن يومئذ عن النعيم ) ٠٠

ئینجا پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ هەڵساو بە ئەبوو ئەیووبی فەرموو : سبەینێ وەرە بۆ ماڵی خۆمان ..

پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ بەرامبەر بە هەر کەسێ چاکەیەکی لەگەڵا بکردایە حەزی ئەکرد پاداشتی بە چاکەبداتەوە .. بەڵام ئەبوو ئەیووب بەگوێیەوە نەبوو ، بۆیە عومەر ـ خوالێی رازیی بێت ـ وتی :

ئەبوو ئەیووب ، پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ فەرمانت بەسەرا ئەدا کەوا سبەینێ بچیت بۆماڵی خۆیان..

ئەبوو ئەیووب وتی :

«سەرداروگوێڕایەڵم بۆپێغەمبەری خوا ..

بۆ رۆژی دووەم ئەبوو ئەیووب بۆجێ بەجێ کردنی فەرمانەکەی پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ چوو بۆ ماڵیانو ئەمیش لە پاداشتیا کەنیزەکێکی ماڵی

پێبەخشیی کە لە بەردەستیخۆیا بووو پێی فەرمـوو : ئەبوو ئەییووب ، ئامۆژگاریی چاکەی بکە ، چونکە چەندێ بەلادانەوە بووە لەچاکە بەولاوە هیچمان پێوە نەدیوە •

ئەبوو ئەییووب گەڕایەوە ماڵەوە •• دیاری‌یەکـەی پێغەمبەری لەگەڵا بوو • کاتێ خێزانەکەی چاوی پێ کەوت پرسی :

ئەمە هی کێیە ئەبوو ئەییووب ؟ !

وتی : هی خۆمانە ••• پێغەمبەری خوا ـ صلی اللە علیە وسلم ـ پێی بەخشیوین ••

دەی کەواتـە خـاوەن بەخشـیشـں بـەگـەورەو بەخششەکەش بەڕێز بگرە ••

وتی : پێغەمبەری خوا ـ صلی اللە علیە وسـلم ـ ئامۆژگاریی کردووین بە چاکیی لەگەڵیا بجووڵێینەوە • خێزانەکەی وتی :

جاچیی بکەین لەگەڵیا چاکبێ ئامۆژگاری یەکەی پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم - جێ بەجێ بکەین ؟

وتی :

بەخوا بۆ ئامۆژگاری یەکەی پێغەمبەر چاکتر شک نابەم جگە لەوەی ئازادی بکەم ...

وتی : ڕێگای راستت دۆزیوەتەوە ، وە تۆ سەرکەوتوو ئەبیت .

بەمە ئەبوو ئەیووب لەرێی خوادا ئازادی کرد..

ئازادی کرد تاسەر لە نوێ ژیانی ئادەمیانەی بکاتەوە بە بەردا .. تا ئەمی ژیانی راستەقینە بکات ، چونکە لە ترازووی ئیسلاما بەندایەتیی واتە مردن ، هەر چەندە هەموو مافێکی بەندە پارێزراوە لە یاسای ئیسلامدا ، ئازار بوونیشی بریتی یە لەزیندوو کردنەوەی ..

# لەپێناوی بیروباوەڕدا

ئەیوئەییووب هەرچۆن دراوسێیەکی زۆر چاك بوو بۆپێغەمبەری خوا - صلى الله علیە وسلم - هەروەهاش سەربازێکی راستگۆی بەوەفابوو لەبەر دەستیا •• تەنها رەزامەندیی خواو پێغەمبەری ئەویست•• تەنها بەرژەوەندی ئیسلامو موسڵمانەکانی ئەویست ، بۆیە کە هەستی ئەکرد هەندێ لەخزمەکانی - لەبەنی نەججار - دڵیان بەوتەی مونافیقو جوولەکەکان لە خشتە براوەو دژی ئسلامو پێغەمبەری پێشەوا ئەجووڵێنەوە ، زۆری پێناخۆش بوو •• ناچار بوو واز لەهەموو پەیوەندییەك بێنێ کە پێچەوانەی ئاینەکەی بێت •• کە دوژمنی بیروباوەڕ بێت بۆچیی باشە ؟

خزمێ وەفای بۆخواو بۆ پێغەمبەری ئازیز نەبێت و بەچرپ و چاپی خوانەناسان بخەڵەتێ ئەبێ چ کەڵکێکی خزمی موسڵمانی بگرێ ؟

خزمێ خەمی قیامەتی خۆی نەئەخوا ، ئەبێ چۆن خەمی دنیای خزمی موسڵمانی بخوا ؟

ئەوە بوو بەرە بەرە مونافیقەکان خەریك بـــوو قسەیان بکەنەوە یەك دژی موسڵمانەکان و پێغەمبــەری پێشەوایـــان تا بەچــرپ و چاپــی ترسنۆکانە دەریـــان بەڕینن (١) ، جا ئەهاتنە مزگەوت و گوێیان ئەگرت بــۆ

(١) مونافیقان لە هەموو چەرخێکا چینێکی جیاوازن ٠٠ ناونیشانی سەرەکی‌یـــان ترسنۆکی‌یە ، نـــاوێرن راستە و خۆ دوژمنایەتـــیی خۆیان بـــۆ کۆمەڵـــی ئیماندار دەرخەن ٠٠ وا ئەزانن ئەگەر تەنها سەریان بشارنەوە ئیتر بەسەو پاشماوەی لاشەیان دیار نییە٠٠ دەرمانی دۆزینەوەی ئەو کۆمەڵە ترسنۆکە لەلایەن موسڵمانانەوە ، لەخواترسانە ٠٠ باوەش کردنە بە قورئانا ٠٠ پەروەردە کردنی دڵو دەروونە لەسەر خواپەرستیی ، تابەشێـــوەیەکی بیر لـــێ نەکراوە خوای گەورە دەست نیشانیان بکابۆیان وپشتیان پێ نەبـــەستن ٠٠ ئەگینـــا کەمتەرخەمیی کردنـــی موسڵمانـــان لەخواپەرستییـــدا ، ئەبێتـــە کوێربوونی چاویـــان و خەڵەتاندنیـــان لە لایـــەن مونافیقانەوە ٠٠ ئەمەش سزایەکی خوایی‌یە ٠٠

وت و وێژی موسڵمانەکان بۆ ئەوەی کە جیا بوونەوە لێیان گاڵتەیـان پێبـکەن و بـەسووکـیی سەیـری ئایینەکەیان بکەن ..

رۆژێکیان پیرێکیان لـە مزگـەوت کۆبوونەوە و سەریان کردبوو بەیەکا بەچپەوە قسەیان ئەکرد کاتێ پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ چاوی پێیان کەوت بەو شێوەیانەوە ، فەرمانی دا بکرێنە دەرەوە . خێرا موسڵمانەکان هەڵمەتیان بردە سەریان و لاقیان گرتن و فڕێیان دانە دەرەوە ..

یەکەم کەسێ کە هەڵسا ئەبوو ئەییووب بوو ، هەڵسا بۆ سەردارێکی موونافیقی خزمی خۆی کەناوی عەمری کوڕی قەیس بوو ، وەکە لە بەنی نەججار و پارێزەری خواکانیان بوو لەسەردەمی نەفامیدا .. دەستی دایە قاچێکی و بەراکێشان فڕێی دایە دەرەوە و ئەویش ئەیوت :

ئەوە ئەبوو ئەییووب لە خەرمانی خورما وشـــك کردنی بەنی (ثعلبە)دا دەرم ئەکەیت ؟ « واتە : زەویی و ناوچەی خۆمانە ! » .

ئەبوو ئەیـــووب بەبـێ وەڵام دانــەوە بــەجێی هێشت و هەڵمەتی بردە سەر خزمێکی تری کە رافعی کوڕی وەدیعە بوو جلەکانی گرت و توند رای کێشا و دای بەدەم و چاویان و لەمزگـەوت کــردیە دەرەوە و ئەیوب : ئۆف ، چ مونافیقێکی پیسی ! لە کوێوە هاتووی بگەڕێرەوە و لەمزگەوتی پێغەمبەری خوادا ـ صلى الله عليه وسلم ـ نەمێنیت ! .

نەك تەنها ئەبوو ئەیووب بەڵکو هەموو موسڵمانێك وەك ئەو سەربازی بە وەفاو دڵسۆز بوو ، هەر کامیانت بگرتایە بە پیاوانە پەیمانی دابوو بەئیسلام، بۆیە هەر یەکە ـ لەوانەی لەوکاتەدا ئامادەی مزگـەوت ـ لەلایەکەوە هەڵمەتی ئەبردە سەر مـونافیقەکان تـا بەشداریی پـــاك

کردنەوەی مزگەوت بکات ••

لەکاتێکا ئەبوو ئەییووب خەریکی دەرپەڕاندنی خزمە مونافیقەکانی بوو ، عومارەی کوڕی حەزم هەستا بۆ زەیدی کوڕی عەمری مونافیق کە ریشێکی درێژی هێشتبۆوە •• عومارە دەستی دایە ریشەکەی و بەبێ بەزەیی رایکێشا تا لەمزگەوت کردیە دەرەوە ، ئینجا بەهەردوو دەستی توند دای بە سەر سنگیا و کەوت بەپشتا و بەپاڵەوە ئەیوت : ملت شکاندم عومارە ••

عومارە وەڵامی دایەوە : خوا لەناوت بەرێ ئەی موناڤیق ، ئەو سزایەی کە خوا بۆتی ئامادە کردووە لەوە بەتینترە •• نزیکی مزگەوتی پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ نەکەویتەوە •

وە ئەبوو موحەممەد لەبەنی نەججار کە بەشداریی جەنگی بەدری کردبوو و ئەبوو موحەممەد و مەسعوودی کوڕی ئەوس هەڵسان بۆ موناڤیقێکی گەنج کە ئەمە یەکەم

گەنجە لە مونافیقەکانا ناسراوبێت ، وەکە ناوی قەیس ی
کوڕی عەمری کوڕی سەهل بوو ، بەسەر شان و ملیـا
رایان کێشا هەتا لە مزگەوت کرایە دەرەوە ..

وە عەبدوڵلای کوڕی حاریث یش هەڵسایەوە بـۆ
حاریثی کوڕی عەمری مونافیق کە قژێکی درێـــژی
هەبوو ، عەبدوڵلا دەستی گایاندە قژەکانی و بەتوندیی
رایکێشا بە زەوییدا هەتا گەیاندی‌یە دەرەوەی مزگەوت.

حاریثی مونافیق وەکو بیەوێ گلەیی‌بکا لەعەبدوڵلا
وتی : زۆر دڵرەقییت بەکار هێنا لەگەڵما ئەی کوڕی
حاریث . عەبدوڵلا وەلامی دایەوە : شایانی ئەوەیت ، ئەی
دوژمنی خوا ، لەسەر ئـەو قورئانـەی کـە لەبارەتەوە
هاتۆتە خوارەوە .. نزیکی مزگەوتی پێغەمبەری خـوا
ـ صلی الله علیه وسلم ـ نەکەویتەوە ، چونکە تـــۆ
گلاویت .

هەروەها موسڵمانێـك لـە بەنـی عەمـری کوڕی

عەوف هەڵسایەوە بۆ برایەکی خۆی کە ناوی (زووەیی) کوڕی حاریث بوو لەمزگەوت کردیە دەرەوە و بە ئۆف و بێزاریی خۆیلێ دەربڕیی و پێی وت : شەیتان بەسەرتا زاڵ بووە و خەڵەتاندووتی •

بەم شێوەیە کۆمەڵی ئیماندار بە فەرمانی پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسلم ـ خزمە مونافیقە ترسنۆکە دڵپیسەکانیان دەرپەڕاندو مزگەوتیان لێ پاك کردنەوە و وەفاداریی ودڵسۆزیی و راستگۆیی خۆیانیان سەلماند بۆ پێغەمبەری ئازیزو ئایینە بێگەردەکەی ••

وە بەم شێوەیە کۆمەڵی ئیماندار لەپێناوی بیروباوەڕدا دەستیان لە هەموو پەیوەندییەکی نەفامیی بەرداو بەدڵ و بەگیان لێ بڕان بۆ خزمەتی ئیسلام ••

# سەربازی دڵسۆز

له ساڵی شەشەمی کۆچیدا پەیمانی حودەیبیه لـه نێوان موسڵمانەکان و قورەیشدا بەسترا ، کە یەکێ لە بەندەکانی ئەوە بوو تاماوەی دەساڵ جەنگ و کوشتار لە نێوانیاندا روونەدات ..

ئەم پەیمانە کارێکی پڕدانایەتیی پێغەمبەری پێشەوا بوو ـ صلی الله علیه وسلم ـ تا بتوانێ لابـکا بـەلای جوولەکەی ئاشوب و ئاگـر هەڵـگیرسێنەردا .. ئـەو جوولەکانەی کە لە خەیبەردا جەمیان خواردبوو و بـە هەموو شێوەیەك پلانیان دائەنا تاعەرەبە بت پـەرستەکان هەڵنێن و لەشکر بەرنە سەر پایتەختی حکوومەتـی ئیسلامیی تازە پێگەیشتوو .

بۆیە بە هەڵهاتنی مانگی موحەڕڕەمی ساڵی حەوتەمی کۆچیی پێغەمبەری خوا ـ صلی الله علیه وسلم ـ خۆی کۆکردەوە تا هێرش بەرێتە سەر خەیبەری ناپاك کـە ،

خاوەنی (١٠) دەهـەزار جـەنـگاوری پڕتفاقـی خاوەن قەڵاو سەنگەری سەخت بوون ، بەمەرجـێ لەشـکری موسڵمانـەکان بریتیی بـوو لـەو هـەزار و چوارصەد سەربازەی کە ئامادەی پەیمانی حودەیبیە بوون ••

کورتەکەی بە کۆمەکیی و پشتیوانیی خوای گەورە لەشکری هیلاك و ماندوو و بـێتفاقی مەدینە ، توانـیی قەڵای سەختی جوولەکەی ئاشوب تێك بشکێنێو لەشکری خراپویست دەست کۆتا بکا ••

جا بەپێی یاساو باوی جەنگ موسڵمانەکان هەندێ لە ئافرەتە جوولەکەکانیان بەدیل گرت (١) کە یەکـێ

---

(١) موسڵمانەکان ناچار بوون کافران بە دیل بـگرن چونکە کافرانیش موسڵمانەکانیان بەدیل ئەگرت بەڵام جیاوازیی بەرنامەی ئیسلام وبەرنامەی کافران لێرەشدا دەرئەکەوێ کە ئیسلام سۆز و رەحمـی زۆری بەکار هێناوە بەرامبەر بەدیلەکانی جەنگ ، بە پێچەوانـەی کافرانەوە کـە هەمـوو خراپەیەك بەرامبەر بە موسڵمانە دیلەکان ئەکەن ••

لەوانە صەفییەی کچی حویەیی کوڕی ئەخطەب بوو کە ئەوە بوو لەدوایيدا بە رەزامەندیی خۆی مۆسڵمان بوو و بووە یەکێك لە خێزانەکانی پێغەمبەر و دایکانی ئیمانداران (١) ...

دوای دوورکەوتنەوە لە ناوچەی خەیبەر بەپێی رەزامەندیی صەفییە خۆی ، کرایە بووك .. جا ئەو شەوە بێ ئەوەی پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم - ئاگادار بێت موسڵمانێکی ئەنصاریی مەترسیی لێ نیشت لە صەفییە و قەومەکەی نەوەکو خراپەیەك دەرهەق بە پێغەمبەری خوا بکەن ، بەتایبەتیی دوای ئەوەی زەینەبی خێزانی سەللامی کوڕی میشکەم ژەهری کرد بە گۆشتی مەڕەوە و خەریك بوو دەرخواردی پێغەمبەری بدا ، بۆیە بڕیاری دا

---

(١) مەگەر بەپشتیوانیی خوا موسڵمان بوونی صەفییە - خوا لێی رازیی بێت - لە نامیلکەیەکی تایبەتییدا پیشکەش بکرێت .

ئەوشەوە لە دەرەوەی چادرەکەدا پاسەوانـی پێغەمبـەری خوابێت •• ئەوشەوە تـا بەیانـی شمشێرەکەی لەکێلان دەرهێنا بوو و بەدەوری چادرەکەدا ئەسووڕایەوە ••

دەمەو بەیان پێغەمبەر ـ صلی الله علیه وسـلم ـ گوێی لەجم و جووڵی بوو ، پرسیی :

چیت ئەوێ ئەبوو ئەییووب ؟

وەڵامی دایەوە :

ئەی پێغەمبەری خوا ، ترسام ئەم ئافرەتە دەسـتت لـێ بووەشێنێ ، چونـکە بـاوك و مـێردو قەومـەکەی کوژران و ئەمیش نەو موسڵمانە و هێشتا دڵی دانەمەزراوە، بۆیە ترسام نەوەکو تووشی زیانێکت بکا •• وتم : ئـەگەر بجووڵێتەوە ، لێتەوە نزیکم ••

پێغەمبەریش فەرمووی :

خوایە ئەبوو ئەییووب بپارێزە ، هەروەك ئەمشەو منی پاراست ••

# داخوازیی سەرەمەرگ

ئەبوو ئەییووب هەروەك موسڵمانێکی تێگەیشتووی دڵو دەروون فراوان بوو هەروەهاش موسڵمانێکی بە غیرەت و کۆڵنەدەر بوو .. موسڵمانێکی بەوەفا بوو بەرامبەر بەو بەڵێنەی کە دابووی بەخواو بە پێغەمبەرەکەی ـ صلی الله علیه وسلم ـ ، بۆیە لەهیچ جەنگێکی ئیسلامیدا ، هەر لەسەردەمی پێغەمبەرەوە هەتا سەردەمی موعاویە ، دوا نەکەوت و بەشداریی هەموویانی کرد مەگەر سا بەیەکێکەوە پەشۆکابێ و نەیتوانێ لەیەکێکی ترا بەشداریی بکا ..

وەکاتێ عەلیی کوڕی ئەبوطالیب ـ خوالێی ڕازیی بێت ـ پایتەختی لە مەدینەوە گواستەوە بۆکووفە، ئەبوو ئەییووبی کردە والیی مەدینە . وە لەجەنگی «خواریج» دا لەگەڵ لەشکری موسڵمانەکانا بووە بە سەرکردایەتیی

عەلی وە بەشداریی نەهرەوانیشی کردووە ..

موعاویە لەساڵی پەنجاو دووی کۆچییدا (١) بەسەرۆکایێتیی یەزیدی کوڕی لەشکرێکی پێکەوە نا بەنیازی رزگارکردنی قیسطەنطینییە ( ئەستانبوول ) . لەوکاتەشا ئەبووئەییووب پیرێکی بەساڵاچوو بوو کەتەمەنی نزیکی هەشتا ساڵیی بوو بۆوە ، ئەلەم تەمەنەدا هاوەڵێکی خۆشەویست و بەڕێزی وەك ئەم لای نەنگ نەبوو بچێتە ژێر فەرماندەیێتیی یەزیدەوە (٢) و لەپێناوی خوادا سواری کەشتیی ببێ و دەریای سپیی ناوەڕاست بەرەو ئەمانجی لەشکری موسڵمان بداتە بەر ..

ئەبووئەییووب چاك لەقورئان گەیشتبوو ئەیزانیی

---

(١) الاعلام ( ٢/٣٣٦) . لەهەندێ ریوایەتا ساڵی پەنجاو پێنجە .

(٢) ژیانی یەزید ئاشکرایە ، ئەتوانی بۆنموونە سەیری پەراوی ( تاریخ الخلفاء )ی « المسیوطی » بکەیت ..

کەقورئان فەرمانی داوە : « انفروا اخفافا وثقالا » ئیتر ماوەی کەمتەرخەمیی و گۆشەگیریی نی‌یە •• کەواتە لەئیسلاما خانەنشینی نی‌یە ، بەڵکو موسڵمان ئەبێ هەتا هێزی تیایە و هەتا دڵی‌ئیش ئەکا ، بەشەوو بەرۆژ ، چەندی لەتوانادا هەیە ، نەوەستێ و ئیش بکا ، خزمەت‌بکا ، چاکەو ئاسایش بڵاو بکاتەوە ، تابەم شێوەیە پێویستی‌یە جۆربە جۆرەکانی کۆمەڵی ئیماندار بە زووترین کات‌و لەباشترین شێوەدا بێنەدی • بەمە کۆمەڵی ئیماندار بە ساڵێك گەشە کردنی چەندەها ساڵی کۆمەڵانی تروەدەست دێنێ •• ئەمەیە چارەسەر و نەخشە تاکۆمەڵی ئیماندار پێشکەوێ و بحەسێتەوە •

بەڵام خوا ویستی وابوو دوای کەمێ لەدەست پێکردنی جەنگ لەگەڵ دوژمناندا ، ئەبووئەیووب نووشی نەخۆشی‌یەکی سەخت بوو بەشێوەیەك پەکی خست‌و توانای نەما بەردەوام بێت لەسەر جیهاد •••

لەکاتێکا لەجێگادا کەوتبوو یەزیدی سەرکردە

بەبۆنەی نەخۆشی‌یەکەیەوە سەری لێ‌داو لێ‌ی پرسی :

ئایا هیچ پێویستییت هەیە ئەبوو ئەیووب ؟

ئەبووئەیووبی موسڵمان ، ئاواتی موسڵمانی لەبەر چاو بوو کەبریتی‌یە لەسەرخستنی ئایینی‌خواو بێ‌پەروا چوونە پێشـــەوە تاکافران پەرتـەوازە کەن‌و کـۆت و زنجیری مرۆڤە چەوساوەکان بشکێنن ، وتی :

سەلامم بگەیەنە بەسەربازە موسڵمانەکان و پێتـان بڵێ : ئەبووئەیووب وەسێتی کردووە بۆتان هەتا ئەتوانن بەناو خاکی دوژمندا بڕۆنەپێشـــەوە تابگەنـە دوورترین شوێن و تەرمەکەی ئەویشتان باپێ‌بێت ، جا لەو شوێنەداو لەتەنیشت شووراکانی شاری قیسطەنطینییەدا ، لەخاکی دوژمندا بینێژن ! •

ئەم وەسێتەی کرد و گیانی شیرینی دەرچوو •• لە گەشتی جیهادا تەمەنی پیرۆزی تەواوکرد ، کە زۆربەی

ژیانی بەم گەشتە نایابە رزگاریخوازانەوە بەسەر ئەبرد••

موسڵمانی دۆست بەخوا بەئاوات گەیشت•• ئاواتی خۆی دەست کەوت کەبریتی بوو لەتەواو کردنی ژیانی لەپێناوی بەرزکردنەوەی بیروباوەڕەکەیدا ••

بەڵێ ، ئەبوو ئەیـوب لەخاکی غەریبیـدا و لـە مەیدانی جەنگدا تەمەنی تەواو کرد ••• جادوای ئەوەی یەزیـدی سـەرکردە نوێـژی لەسـەرکرد ، سـەربازە موسڵمانەکانیش مەردانە ئاواتەکـەیان بۆ بـەدی هێنـاو دەستیان دایە هێرش بۆسەر دوژمنان ••

بەهێرش دوای هێرش دایان گرتنەوە تابەردەمیان پێ چۆڵ کردن و گەیشتنە شووراکانی پایتەختی رۆمەکان و تەرمەکەی ئەبووئەیووبیشیان پێ بوو ، بە هەلیان زانی ، بۆیە لەخاکی کافراندا گۆڕیان بۆ هەڵکەنـدو لاشـەی پیرۆزیان سپاردە گڵ ••

بەڵام خوا ویستی وابوو رزگارکردنی پایتەختی

کافران دوابخات ئەو کاتە موسلْمانەکان پێیان رزگـار نەکرێت و هەروا بمێنێتـەوە تا سـەردەمی خەلافـەتی عوثمانی‌یەکان ، ئەوسا رزگاربکرێت و بکرێتە بنکەیەکی گرنگ بۆگەشەکردنی ئیسلام ..

وەخوا ویستی وابوو رێزو خۆشویسـتنێك بـە ئەبوئەییووب ببەخشێت تائەوە بوو کە پێغەمبەری خـوا ـ صلی اللـە علیە وسـلم ـ لە خـواپاڕایەوە بـۆی تـا پارێزگاریی بکـا لەپاداشـتی پارێزگاریی کـردنی ئـەو شەوەیدا کە لە خەیبەر گەڕایەوە ، خوای گەورە لێی وەرگرت و لەهەموو هەلْوێستێکا پارێزگاریی لێکرد ، هەتا لەگۆڕەکەیشیدا کەچەنـد صەدسـالْێك لە خـاکی رۆمدا بوو ، زیاد لەپاراستنیشی ، هەرکاتێ بێ بارانی‌یان بکێشایە ئەچوونە سەرگۆرەکەی تا بەلْکـو بەبۆنـەی ئەوەوە خوارەحمیان لەگەلْا بکا (١) ..

---

(١) ئەمـە بیروهەسـتی ئیسلامـیی نی‌یـە ، بـەلْام رۆمەکان کە موسلْمان نەبوون پێی هەلْئەستان ..

لەوشەوەدا کە موسڵمانەکان هێرش ئەبەن و ئەبوو ئەیووب ئەنێژن ، ڕۆمەکان پرسیارئەکەن :

ئەمشەو چیتان بوو ؟

موسڵمانەکانیش هەواڵیان ئەدەنێ کەئەمە هاوەڵێکی بەڕێزی پێغەمبەرە ـ صلی الله علیـه وسلم ـ وەسێتی کردووە لە خاکی دوژمندا بینێژین ..

ڕۆمەکان بەوپەڕی سەرسوڕمانەوە بەیەزید ئەڵێن : خۆیشت و ئەوەش کە ناردوویتی زۆر بێ ئاگان . چۆن ئێوە بێخەم بوون لێمان و نەترسـان بیکەنینـەوە و ئێسقانەکانی بسووتێنین ؟!

یەزید چیی‌بلێ باشە ؟!

سوێندیان بۆ ئەخوا ئەگەر بەنیازی خراپەوە دەستی بۆ بەرن چیی کلیسا و گۆڕی پیاوچاکانیان واله خاکـی ئیسلامدا هەمووی ئەڕووخێنم و بەربادی ئەکەم . ئەوسا

ئەوانیش بەپێی ئایینی خۆیان سوێندیان بۆ خوارد کەوا ڕێزی لێ ئەگرن و هەتا تواناشیان هەبێ پاسەوانیی ئەکەن ..

ئەو ڕۆژە پاڵەوانی مەیدانی جیهانیی ، موسڵمانەکان بوون ، دیارە ئەمەش خەڵاتی جیهادە .. بۆیە کافران توانای دژایەتیی و ناپاکی‌یان نەبوو بەرامبەر بەموسڵمانەکان .. ئەو ڕۆژە موسڵمان سەربەرز بوو .. خاك وئاوی لەلایەن کافرانەوە زەوت نەکرابوو .. قورئانی پیرۆز بەرنامەی ژیانیان بوو ، گەنج و خوێندەواران خەریکی هەوڵو کۆششی بێ وچان بوون بۆ بەرزکردنەوەی ئیسلام .. بۆیە کافران لە پایتەختەکەشیاندا ـ کە قەڵایەکی وەها سەخت بوو ولەشکری ئیسلام بۆ چەند صەدەیەك نەیتوانی رزگاری کا ـ هێشتا نەیانئەوێرا دژی موسڵمانەکان بجووڵێنەوە ..

ئەی ئەمڕۆ ؟!

بێگومان ئەمڕۆ پێچەوانەیە ! •

دیسان بێگومان خوا کۆمەك و پشتیوان بێ ، بۆی ئەچینەوە و بەوبەرزیی و بلندی‌یە ئەگەینەوە کاتـــێ باوەش کەینەوە بە قورئان پیرۆزا ••

لەکۆتاییدا داوا ئەکەین لەخوا بمانخاتە سەر ئەو ڕێبازە ڕاستەی کە ڕەزامەندیی ئەومان دەست ئەخات و لە ئەبوو ئەییووب و هاوەڵانیشی ڕازیی بێت ••

وآخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين •

## سەرچاوەکان

| | پەڕاو | دانەر |
|---|---|---|
| ١ | الاصابة في تمييز الصحابة | ابن حجر العسقلانى |
| ٢ | الاستيعاب لمعرفة الأصحاب | ابن عبدالبر |
| ٣ | السيرة الحلبية | الحلبي |
| ٤ | السيرة النبوية | ابن هشام |
| ٥ | سيرة دحـلان | دحـلان |
| ٦ | حياة الصحابة | كاند هلوي |
| ٧ | القصص الاسلامية | الحكمي |
| ٨ | فقـه السيرة | محمد سعيد رمضان البوطي |
| ٩ | فقـه السيرة | محمد الغزالي |
| ١٠ | صفة الصفوة | ابن الجوزي |
| ١١ | السمط الثمين | الطبري |
| ١٢ | غزوة خيبر | باشميل |
| ١٣ | الرسول في قلوب اصحابه | وليد الاعظمي |
| ١٤ | نسـاء النبى . | عائشة عبدالرحمن |
| ١٥ | صور من حياة الصحابة | عبدالرحمن رافت الباشا |

# ئـەم زنجیرەیە

تا ئێستە ئەم نامیلکانە دەرچوون :

١ ــ عومەیری کوڕی سەعد .

٢ ــ نوسەیبەی کچی کەعب .

٣ ــ عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف .

٤ ــ عەبدڵڵای کوڕی مەسعوود .

